# أصول السنة

لإمام السنة أحمد بن حنبل

١٦٤ – ٢٤١ هـ

رحمه الله

## به كوردى

وەرگێڕانی

هاوکار کوردی

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : أصو السنة ( بەکوردی )

نووسەر : پێشەوای سوننەت ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

بابەت : بیروباوڕی سەلەفی صالح ( عەقیدە )

وەرگێڕ : هاوکار کوردی

دیزاینی بەرگ : د.بێدار سلێمانی ( ئەڵمانیا )

ژمارەی سپاردن : ژمارەی (    )ی ساڵی ( ٢٠٢٠ ) زایینی پێدراوە

أبو يعلى الحنبلى له وەسفى كتێبى ( أصول السنة )دا دەڵێت :

**لو رُحِلَ إلى الصين في طلبها لكان قليلا**

واته : ئەگەر سەفەر بكەيت بۆ وڵاتى صين بۆ بەدەست هێنانى ئەم كتێبە هەركەمە



## پێشەکی وەرگێڕ

ئیبنو عبدالبەڕی مالکی دەڵێت : **هەرکەسێك لەسەر ڕێباز و ڕێچکەی سەلەف لایدا گومڕا و گومڕاکار دەبێت** . وە سەلەف چاکترین و پاکترینی مەنهەجە بۆ تەسلیم کردنی عەقیدە بۆی . وە تەرازووە بۆ ناسینەوەی پیاو . وە یەکێك لەو پیاوانەی کە ڕێبەر و سەرکردە و ئەستێرەیەکی گەشی ئەم جیلە موبارەکەیە ئەویش پێشەوا و سەرخەری سوننەت لە ڕۆژی فیتنەدا ( **ئیمامی ئەحمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕە حەنبەلە** ) نوقمی میهری پەوەردگاربێت و گۆڕەکەی پڕنوور بێت . کە سەلەف دەربارەی دەفەرموون : **ئیسلام دووجار مرد و ژیاوە جارێك ئەبوبکری صدیق ژیانی پێداوە لە کاتی موڕتەدبوونەوەی عەرەب . وە جارێکیش ئیمامی ئەحمەد لە فیتنەی خەڵقی قورئان** . بۆیە خاوەن پێگەیەکی مەزنە لە ئیسلام و موسڵمانان وە منەتی بەسەر هەموو ئومەتی ئیسلامەوە هەیە تاوەکو ڕۆژی قیامەت . خاوەنی چەندین پەڕاوە کە لەلایەن کوڕ و قوتابییەکانی ڕیوایەت کراوە . یەکێك لەو ڕیسالە نایابانەی کە هەیەتی ( أصول السنه )-یە کە تێیدا بە کورت و پوختی مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت باس دەکات . منیش ئەمڕۆ کە دەکاتە ( ٢٠ / ١٠ / ٢٠٢٠ ) بەهۆی نەخۆشیەوە داخل کرابووم لە نەخۆشخانە مەجالێکم بۆی وەرگرت لەدوای نوێژی بەیانیەوە دەستم بە وەرگێڕانی کرد تاوەکو نوێژی عەسری هەمان ڕۆژ کۆتایم پێهێنا سوپاس بۆ اللّٰه تعالی بۆ ئەوەی ببێتە سوود بۆ قوتابیانی زانستی شەرعی بە

تايبەت وە خوێنەرانی کتێبەکانی سەلەف بە گشتی . وە لەبەر گرینگی پێگەی کتێبەکە و پێویستی وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی حەزم کرد تەرجومەی ئەم مەتنە موبارەکە بکەم . داواکارم لە اللّٰه تعالى بیکاتە مایەی لێخۆشبوونی تاوانەکان و داپۆشینی کارە نابەجێیەکانم وە ببێتە زەخیرە بۆ قیامەتی سەختی کۆتام وە بەهەشت جێگای من و گشت و دۆست و یارانم ...والسلام علیکم .

براتان

هاوکار کوردی

## كورتەی ژیانی ئیمامی ئەهلی سوننه ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

**ناوی** : ئەحمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی حەنبەلی کوڕی هیلالی عەرەبی عەدنانی شەیبانیه ئیمامه له فیقهـ و فەرمووده . به باوکی عبدالله ناسراوه .

**لەدایك بونی** : له مانگی ڕەبیعی یەکەم ساڵی ١٦٤ له بەغدا لەدایك بووه .

**زانستی** : سەرەتا قوتابیەکی سەرەتایی بوو له داواکردنی زانست و داواکاری فەرمووده نەبوو . تا تەمەنی شازده ساڵی دوای ئەوه دەستی به داواکردنی فەرمووده کردووه بەبێ ئەوەی سەرەتاکان له عێراق بچێته دەرەوه هەر لەو وڵاته فیقهـ و فەرموودەی خوێندووه . دواتر هاوڕێکانی کۆبونەوه بۆ ئەوەی دەرچن بۆ وڵاتانی تر بۆ داواکردنی زانست بەڵام ئیمامی ئەحمەد هەژار و کەم دەرامەت بوو نەیتوانی لەگەڵ ئەوان بڕوات بەڵام دواتر بەبێ هیچ سوارێك بۆ داواکردنی فەرمووده ملی نا بۆ وڵاتی یەمەن بۆلای عبدالرزاق خاوەنی ( المسند ) کاتێ گەیشت ئازار و دەرد زۆر لەسەر لاشەی بەدیار کەوت لەبەر سەرفەرەکەی که له عێراقەوه بۆ یەمەن بەس بەپێ ڕۆیشتووه . کاتێ بەپێ گەیشته مەککه پێی وترا : ئازاری خۆت داوه ئەی باوکی عبدالله ئیمام فەرمووی :وەك ئازاری سەفەرەکەی عبدالرزاق نەبوو که سوودمان بینی لێی فەرموودەی الزهري له سالم له عبدالله له باوکی . وه فەرموودەی الزهري له سەعیدی کوڕی مسیب ئەویش له ئەبی هریره —مان لێ وەرگرت . ئەوکاتەی ئیمامی شافعی له وڵاتی مصر بوو نامەی بۆ ئیمام نارد که بێته لای بەڵام لەبەر بێ پارەیی نەیتوانی بچێت . دواتر که ئیمام شافعی هاتەوه بۆ بەغدا ئیمام ئەحمەدی بینی پێی

ووت : **ئەی باوكی عبداللّٰه ئەگەر فەرموودەی صەحیحت لایە فێرم بكە لێی** .
هۆكاری ئەم هەژاری و بیٚ پارەییەی ئەوەبوو كە پارەی لە هیچ كەسێك وەرنەدەگرت بەتایبەت خەلیفەكان كە زۆر پارەیان بۆ دەنارد ڕەتی دەكردەوە .

**شایەتی زانایانی سەلەف لەسەر زانستەكەی** :

یەكەم : **ئیمامی شافعی** دەڵێت : لە عێراق دەرچووم پیاوێكم نەبینی چاكتر و زاناتر و تەقوادارتر لە ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حنیل كە جێم هێشتبێت .

دووهەم : **ئیمامی البخاري** دەڵێت : كاتیٚ لە زانست نمونە بە ئیمام ئەحمەد دەهێنراوە لە زانایی ئێمە لە بەصرە بووین گوێم لە أبا الولید الطیالسي بوو دەیفەرموو : ئەگەر ئیمامی ئەحمەد لەناو بەنی ئیسرائیل بوایە لە زاناترینی زاناكانیان دەبوو .

سیٚ یەم : **علي بن المدیني** دەڵێت : ئەگەر تاقی بكرێمەوە بە شتێك ئەوە بە ئەحمەد تاقی بكرێمە گوێی پێنادەم ئەگەر گەیشتمەوە دیداری اللّٰه تعالی چۆن بم .
چوارەم : **یحیی بن معین** دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد كۆمەڵێك سیفات و تایبەتمەندی تێدایە هەرگیز لە هیچ زانایەكی ترم نەدیوە فەرموودەناس و حافز و زاهد و عاقڵ .

پێنجەم : **أبو زرعة الرازي** دەڵێت : لەژیانم لەو فەقیە–ترم نەدیوە .

**قوتابیەكانی** : یزید بن هارون و البخاري و مسلم و أبو داود و علي بن المدیني و دوو كوڕەكەی : صالح و عبداللّٰه و كوڕەمامەكەی حنبل بن إسحاق و أبو زرعة الرازي و أبوبكر أحمد بن محمد بن هانئ الطائي و أبو حاتم الرازي و موسی بن هارون و عثمان بن سعید الدارمي .

**بەرهەمەکانی** : الرد على الجهمية و كتاب الصلاة و **كتاب السنة** و كتاب الزهد و فضائل الصحابة .

**وەفاتی** : پێشەوا نەخۆش کەوت لە سەرتاکانی مانگی ڕەبیعی یەکەم لە ساڵی ٢٤١ کۆچی لە بەغدا وەفاتی کرد ئامادەبوانی جەنازەکەی هەرگیز حەشاماتی لەو شێوە نەبینراوە و نابێتەوە . هەزار ڕەحمەت لە گیانی ئیمام .

## ( دەست گرتن بەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر صلی علیە وسلم لەسەری بوون )

باوکی عبداللّه ئەحمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی حەنبەل بەڕەحمەت بێت دەفەرمووێت : بنەماکانی سوننەت لای ئێمە ( ئەهلی سوننە ) بریتین لە :

دەست گرتن بەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی اللّه علیە وسلم لەسەری بوون وە چاولێکردن و پێشەگن بوون پێیانەوە . وە وازهێنان لە داهێنان لە دین . وە هەموو داهێنانێك لە دین گومڕاییە . وە وازهێنان لە دەمەتەقێ و دانیشتن لەگەڵ هاوەڵانی هەواو و ئارەزوو . وە وازهێنان لە موناقەشە و دووبەرەکی و دەمەتەقێ لە دیندا . وە سوننەت لای ئێمە : ئاثاری پێغەمبەرە صلی اللّه علیە وسلم . وە سوننەت ڕوونکەرەوەی قورئانە . وە بەڵگەیە بۆ قورئان . لە سوننەت قیاس نیە . وە نمونەی پێ ناهێنرێتەوە وەك ڕدانەوەی یان ڕەخنە گرتن لێی . نە عەقڵ نە هەوا و ئارەزوو دەتوانی پەی پێ ببات . بەڵکو تەنها شوێن کەوتن و وازهێنان لە هەوا و ئارەزووە . ئەم سوننەتە واجب و پێویستە کە ئەوەی واز لە تایبەت مەندیەکی بێنێت لێی وەرناگیرێت وە ئەوەی باوڕی پێ نەبێت لە خاوەنانی سوننەت نیە .

## ( باوەڕهێنان بە قەدەر خێر و شەڕی )

لەم سوننەتە واجب و پێویستانەی کە ئەوەی واز لە تایبەت مەندیەکی بێنێت لێی وەرناگیرێت وە ئەوەی باوڕی پیّ نەبێت لە خاوەنانی سوننەت نیە ئەوەیە :باوەڕهێنان بە قەدەر خێر و شەڕەکەی . وە بەڕاست زانینی هەموو ئەم فەرموودانەی کە دەربارەی قەدەر هاتووە . وە باوەڕبوون پێیان . بەرامبەر قەدەر نالّێین ( بۆچی ؟ ) وە ( چۆن ؟ ) بەڵکو ئەوەی لەسەرمانە بە ڕاست زانینی و باوەڕبوونە پێی . ئەوەی ڕاستی و ڕاڤەی ئەم سوننەتەی نەزانی وە عەقڵی پێی نەگەیشت بە ڕاست زانینی و باوەڕبوونە پێی بەسە . ئەوەی لەسەرتە باوەڕهێنان و تەسلیم بوونە پێی . نمونەی فەرموودەی ( **الصادق المصدوق** )[1] وە نمونەی ئەوانە وەك نمونەی فەرموودەکانی تر لەسەر قەدەر . وە نمونەی فەرموودەکانی ( **بینینی الله تعالى لە ڕۆژی قیامەت لەلایەن بڕواداران** ) [2] ئەگەرچی بیستنی نامۆش بن لەسەر گوێچکەکان وە بیسەر لای تازە بێت . بەڵکو ئەوەی لەسەرمانە باوەڕبوونە پێی . وە ڕەت نەکردنەوەی هیچ پیتێك لێی . وە جگە لەوانەش لەو فەرموودانەی کە هاتوونە لە متمانەداران . وە هیچ کەسێك دەمەتەقیّ و موناقەشەیان ناکات . چونکە قسەکردن لەسەر ( قەدەر ) و ( بینینی الله تعالى لە قیامەت ) و ( قورئان ) وە جگە لەوانەش لە سوننەت . ناپەسەند و نەهی لێکراوە وە ئەو کەسە نابێتە ئەهلی سوننە

---

( ١ ) **وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ** : " إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ فِي أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ إِلَيْهِ الْمَلَكُ، فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، فَوَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ، إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا ( صحيح البخارى برقم : ٦٥٩٤ )

(٢) فەرموودەکانی بینینی الله تعالى گەیشتۆتە حەدی التواتر کە لە زیاد لە دە هاوەڵی پێغەمبەری نازدار گێڕدراوەنتەوە .

ئەگەرچی بە وتە جێبەجێی کردبێت تاوەکو واز لە موناقەشە و دەمەتەقێ نەهێنێت وە تەسلیم و باوەڕدار نەبێت بە ئاثار .

## ( قورئان وتەی پەروەردگارە و مەخلوق نیە )

قورئان : وتەی پەروەردگارە و مەخلوق نیە . وە سوننی نابێت لاوازبێت لە وتنی قورئان مەخلوق نیە بەڵکو بە صەراحە و بە جورئەتەوە بڵێن : قورئان مەخلوق نیە چونکە وتەی پەروەردگار لەخۆی جیا نیە . ئاگاداربن لە موناقەشەکردن لەگەڵ ئەو کەسەی کە کەوتۆتە ناو فیتنەی خەڵقی قورئان . وە هەرکەسێ بڵێت : وتەی ئێمە بۆ قورئان مەخلوقە . وە جگە لەویش . وە هەرکەسێك بوەستێت تێیدا کە بڵێت : نازانم مەخلوقە یان مەخلوق نیە . بەڵکو وتەی پەروەردگارە ئەوە خاوەنی بیدعەیە وەك ئەو کەسە وایە کە دەڵێت ( **قورئان مەخلوقە** ) بەڵکو قورئان وتەی پەروەردگارە و مەخلوق نیە .

## ( باوەڕبوون بە بینینی اللّه تعالی لە ڕۆژی قیامەت )

باوەڕبوون بە بینینی اللّه تعالی لە ڕۆژی قیامەت وەك چۆن لە لە فەرموودە صەحیحەکان لە پێغەمبەرەوە صلی اللّه علیه وسلم ڕیوایەت کراوە جێگربووە . وە پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم پەروەردگاری بینیوە . ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم هاتووە لەبارەی بینینی اللّه تعالی صەحیحە **قەتادە** لە **عیکرمە** ئەویش لە **ئیبنو عەباسەوە** ڕیوایەت دەکات . وە **حەکەمی کوڕی ئەبان** لە **عیکرمە** ئەویش لە **ئیبنو عەباس** ڕیوایەت دەکات . وە **عەلی کوڕی زەید** لە **یوسفی کوڕی میهران** ئەویش لە **ئیبنو عەباس** ڕیوایەت دەکات . وە فەرموودە لای ئێمەی ئەهلی سوننە لەسەر ڕووکەشی دەقەکە دەڕۆین بەم جۆرەی لە پێغەمبەرەوە صلی اللّه علیه وسلم هاتووە . وە قسەکردن لەسەری بیدعەیە . بەڵکو باوەڕ دەهێنین بەم جۆرەی لە ڕووکەشی هاتووە . وە لەسەریدا موناقەشەی هیچ کەسێك ناکەین .

## ( باوەڕبوون بە تەرازوو - كێشان لە ڕۆژی قیامەت )

باوەڕبوون بە تەرازوو – كێشان لە ڕۆژی قیامەت وەك ئەوەی لە دەقەكانی قورئان و سوننەت هاتووە باوڕ پێی دەهێنین . بەندە لە ڕۆژی قیامەت دەكێشرێت كە كێشی باڵە مێشولەیەكیشی نیە . وە كردەوەی بەندەكان دەكێشرێت وەك لە ئەسەر هاتووە . وە باوەڕهێنان و بەڕاست زانینیان . وە پشت كردن لە گشت ئەو كەسانەی كە ڕەتی دەكەنەوە . وە وازهێنان لە موناقەشەكردن لەسەری .

## ( اللّه تعالى لە ڕۆژی قیامەت قسە لەگەڵ بەندەكانی دەكات )

اللّه تعالى لە ڕۆژی قیامەت قسە لەگەڵ بەندەكانی دەكات بەبێ هەبوونی هیچ وەرگێڕێك لە نێوان بەندەكانی و خۆی . وە باوەڕهێنان و بەڕاست زانین پێی .

## ( باوەڕهێنان بە حەوز )

باوەڕهێنان بە حەوز . بەوەی كە لە ڕۆژی قیامەت پێغەمبەر صلى اللّه عليه وسلم حەوزێكی پێ دەبەخشرێت كە ئوممەتەكەی لێی كۆدەبنەوە بۆ خواردنەوەی وە هەندێكیش دووردەخرێنەوە . پانیەكەی وەك درێژیەكەیەتی كە مانگە ڕێیەكە پەرداغەكانی بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەكانی ئاسمانە لەسەر ئەم هەواڵانەی بە صەحیحی هاتوون لەسەری لە جگە لە ڕوویەكەوە .

## ( باوەڕهێنان به سزای گۆڕ )

باوەڕهێنان به سزای گۆڕ . بەوەی کە ئەم ئوممەتە لە گۆڕەکانیان تاقی دەکرێنەوە وە پرسیار دەربارەی ئیمان و ئیسلام لێی دەکرێت . بەوەی کە کێ پەروەردگارتە ؟ وە کێ پێغەمبەرتە ؟ وە دوو فریشتە دێن بەناوی نەکیر و مونکەر بۆ لێ پرسینەوە چۆن اللّه ویستی لەسەرە و وەچۆن دەیەوێت ئەوە بەدەست ئەوە . ئەوەی لەسەر ئێمەیە باوەڕهێنان و بەڕاست زانینیانە .

## ( باوەڕهێنان به تکاکردنی - شەفاعەت - پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم )

باوەڕهێنان بە تکاکردنی پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم وە بەو کەسانەی کە لە دۆزەخ دەردەهێنرێن پاش ئەوەی دەسوتێن دەبن بە خەڵوز . فەرمانیان پێ دەکرێت بەوەی کە بچن بۆسەر ڕوبارێك لەسەر دەرگای بەهەشت وەك ئەوەی لە ئەسەر هاتووە . چۆن اللّه ویستی لەسەرە و وەچۆن دەیەوێت ئەوە بەدەست ئەوە . ئەوەی لەسەر ئێمەیە باوەڕهێنان و بەڕاست زانینیانە .

( باوەڕهێنان بەوەی کە مەسیحی دەجال دەردەچێت وە لەنێوان چاوەکانی نوسراوە کافر )

باوەڕهێنان بەوەی کە مەسیحی دەجال دەردەچێت وە لەنێوان چاوەکانی نوسراوە کافر وە هەموو ئەو فەرموودانەی دەربارەی هاتووە . وەباوەڕبوون بەوەی کە مەخلوقێکە و خاوەن ژیانە . وە باوڕ بەوەی کە عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت لە دەرگای( لود ) دەیکوژێت .

( ئیمان بریتیە لە : وتە و کردەوە وە زیاد و کەم دەکات )

ئیمان بریتیە لە : وتە و کردەوە وە زیاد و کەم دەکات وەك لە قورئان و سوننەت هاتووە ( **تەواوترینی باوڕی بڕواداران چاکترینی ڕەوشتەکانە** )[٣]

( نوێژ نەکەر کافرە )

وە هەرکەسێك واز لە نوێژ بێنێت ئەوە **کافرە** . وە هیچ کردەوەیەك وازهێنان لێی کوفر نیە ئیلا نوێژ نەبێت . هەرکەسێ وازی لێبێنێت ئەوە **کافرە** و اللّه تعالى کوشتنی حەڵاڵ کردووە .

(٣) الترمذي : الرضاع ( ١١٦٢ ) . وأحمد ( ٢/٢٥٠ ) . الدارمي : الرقاق ( ٢٧٩٢ )

## ( چاكترينى ئوممەت پاش وەفاتى پێغەمبەر صلى اللە عليه وسلم )

چاكترينى ئوممەت پاش وەفاتى پێغەمبەر صلى اللّه عليه وسلم **ئەبوبكرى ڕاستگۆيە** لەپاشان **عومەرى كوڕى خەتاب** لە پاشان **عوسمانى كوڕى عەفان** . پێش خستنى ئەم سێيانە هاوەڵانى پێغەمبەر صلى اللّه عليه وسلم پێشيان خستوون وە هيچ ناكۆكيەك نيە لەسەر ئەمە . لە پاشاندا پاش ئەم سىٚ كەسە پێنج هاوەڵانى شورا دێن ئەوانيش : **عەلى كوڕى ئەبە تالب** و **تەڵحە** و **زوبەير** و **عبدالرحمن–ى كوڕى عەوف** و **سەعد** هەموويان دەگونجێن بۆ خيلافەت وە هەموويان ئيمامن . چون بۆ ئەمە دەچين بو فەرموودەكەى ئيبنو عومەر ( **ئێمە ئەم سێيانەمان دەژمارد بەدواى يەكەوە وە پێغەمبەر صلى اللّه عليه وسلم زيندوو بوو كە چاكترينى دواى خۆى ئەبوبكرى ڕاستگۆيە لەپاشان عومەرى كوڕى خەتاب لە پاشان عوسمانى كوڕى عەفان .لە پاش ئەم سێيانە بێدەنگ بووين** )[٤] لەپاش هاوەڵانى شورا **بەژداربووانى جەنگى بەدر لە كۆچبەران دێت** لەپاشان **بەژداربووانى جەنگى بەدر لە سەرخەران دێت** . لە هاوەڵانى پێغەمبەر صلى اللّه عليه وسلم لەسەر ئەندازەى كۆچكردن و پێشينە دێت . يەكەم دواى يەكەم . لە پاشان چاكترينى خەڵك دواى ئەم سەردەمى هاوەڵاندا كە پێغەمبەرى تێدا ناردرابوو صلى اللّه عليه وسلم . وە هەموو كەسێك كە هاوەڵێتى كردووە ساڵێك يان مانگێك يان ڕۆژێك يان كاژمێرێك ياخو تەنها بينويەتى ئەوە لە هاوەڵان دەژمێردرێت بە ئەندازەى هاوەڵێتى كردنى . وە هەبوونى پێشينە لەگەڵى وە بيستن لێى . وە يەك جار بينينى . بچوكترينى ئەم مەرجى هاوەڵێتيە چاكترە لە

---

( ٤ ) مسند الإمام أحمد برقم : ١٤/٢

كەسی ئەم سەردەمەی نەی بینیوە  ئەگەر بگەڕێتەوە بۆلای اللّه تعالى بە گشت كردەوەكانی لە چاكە . ئەوانەی هاوەڵێتی پێغەمبەریان كردووە صلی اللّه علیه وسلم بینیویانە و گوێبیستی بوونە . وە ئەو كەسەی بەچاو بینویەتی وە باوڕی پێهێناوە ئەگەر كاژمێریكیش بێت ئەوە چاكترە لە هاوەڵێتی لە تابعین ئەگەر هەموو كردارێكی خێریش بكەن .

## ( گوێڕایەڵی كردن بۆ دەسەڵاتداران و ئەمیری بڕواداران )

گوێڕایەڵی كردن بۆ دەسەڵاتداران و ئەمیری بڕواداران چاك و خراپەكاری یەكێكە لە بنەماكانی ئەهلی سوننە ئەوەیە :  هەركەسێك خیلافەت بەڕێوەببات . وە خەڵك لەسەری كۆبوونەوە بە بەیعەتدان و پێی ڕازی بوون . وە هەركەسێ بە شمشێر خیلافەتی وەرگرت وە ناوی لێنرا ئەمیری بڕواداران ئەوە جیهاد لەگەڵی دەكرێت و گوێڕایەڵی دەكرێت تا ڕۆژی قیامەت لەدوای چاك و خراپی وە هەرگیز واز لەو گوێڕایەڵی و جیهادە ناهێنین لەگەڵی . وە بەشی دەست كەوت و جێبەجێ كردنی سنورەكان وەك : ڕجمی زیناكار و حەدی شەراب خۆر و كوشتنەوەی بكوژ و بڕینی دەست ..هتد بۆ دەسەڵاتدرانە و پێی هەستن تاوەكو قیامەت . بۆ هیچ كەسێك نیە تەعن بدات لێیان  وە ناكۆكیان لەگەڵ ناكرێت . وە زەكات دەبردرێتەوە بۆلایان هەركەسێ بۆلایانی بردەوە ئەوە ئەوە پابەندبووە بە گوێڕایەڵی . بۆ چاك و خراپی وە نوێژی هەینی لە پشت دەكرێت وە لەپشت ئەو كەسەش كە خەلیفە بە والی

دايدەنێت . تەواوى دوو ڕكاتەكە . هەركەسێك نوێژكردن لە دوايان دووبارە بكاتەوە ئەوە بيدعەچيە و وازى لە ئاثار هێناوە . وە پێچەوانەى سوننەتى كردووە . وە هيچ فەزلێك لە نوێژ و ڕۆژى هەينى بەرناكەوێت و بۆى نيە ئەگەر : نوێژكردن لەدواى دەسەلاّتدارانى لێى نەبينرێت لەدواى چاك و خراپيەوە . سوننەت ئەوەيە : دوو ڕكات نوێژى هەينى لەگەڵيان بكرێت . وە بەو پەڕى ديندارييەوە بەبێ هيچ گومانێك لە سنگ و دڵى ، وە هەركەسێك دەرچێت لەسەر ئيمامێك لە ئيمامەكانى موسڵمانان لە كاتێكدا خەڵك لەسەرى كۆبونەتەوە و دانيان ناوە بە خيلافەتەكەى بەهەر ڕووەك لە ڕووەكان بە ڕازى بوون يان بە زاڵ بون دەست بەسەرداگرتن . ئەوە ڕيزى موسڵمانانى تێكداوە و دەرچووە وە پێچەوانەى ئاثارى كردووە كە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە وە ئەگەر بمرێت و خروجى كردبێت ئەوە مردنێكى جاهيلانە مردووە . درووست نيە جەنگ و كوشتارى دەسەلاّتداران بكەيت و وە بۆ هيچ يەكێك لە خەڵك نيە لێيان دەرچێت هەركەسێك ئەوكارەى كرد ئەوە بيدعەچيە لەسەر غەيرى ڕێگاى سوننەتە .

## ( كوشتارى كردنى دزەكان و خەواريجەكان )

كوشتارى كردنى دزەكان و خەواريجەكان درووستە ئەگەر هاتوو پياوێك ديفاعى كرد لە نەفس و ماڵى خۆى . بۆى هەيە كوشتاريان بكات لەسەر ديفاع كردنى نەفس و ماڵى وە بە هەموو توانايەك ديفاع بكات . بەڵام كاتێ لێى جيابۆيەوە و وازى لێهێنا بۆى نيە بيانكوژێت . وە بەدواى شوێنەواريان بكەوێت . بۆ هيچ يەكێك نيە ئيلا ئيمام يان والى موسڵمانان نەبێت . بەڵكو تەنها ديفاع لە خۆى دەكات وە لە نيەتيدا نابێت نيازى كوشتنى هيچ كەسێكى هەبێت . ئەگەر هاتوو لەسەر دەستى خاوەن ماڵ بۆ ديفاع لە خۆى و ماڵەكەى دزەكە كوژرا ئەوە الله تعالى كوژراوەكە دووردەخاتەوە بۆ دۆزەخ . وە ئەگەر خاوەن ماڵ لەسەر دەستى دزەكە كوژرا ئەوە لەو حاڵەدا بوو كە ديفاعى لە خۆى و ماڵەكەى دەكرد ئەوە داواى شەهادەتى بۆ دەكەين وەك لە هەموو فەرموودە و ئاثارە كان هاتووە كە فەرمان پێكراوە بە كوشتاركردنيان بەڵام فەرمان نەكراوە بە نيەتى كوشتن و شوێن كەوتنى هەڵهاتووەكانيان . وە كاتێ پێكراوبوو يان بريندار درووست نيە بچيت بيكوژيت وە ئەگەر بە ديل گرتان نابێت بيان كوژن . وە حەدى شەرعيان لەسەر جێبەجێ ناكرێت . بەڵكو بۆ ديارى كردنى مەسيرى كارەكەى دەگەڕێنينەوە بۆلاى ئەو كەسەى ويلاتى لەدەستە لە ئيمام ئەوكات بڕيار دەدات كەچى لێ بكرێت .

**( شایەتی لەسەر هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە لەسەر کردنی کردەوەیەك نادەین بە دۆزەخ و بەهەشت )**

شایەتی لەسەر هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە لەسەر کردنی کردەوەیەك نادەین بە دۆزەخ و بەهەشت . داوای بەهەشت بۆ چاکەکاران دەکەین وە ترسیشمان هەیە لێیان لەوەی کە تووشی تاوان بن . وە ترسمان هەیە لەسەر خراپەکارێکی تاوانبار وە داوای سۆز و بەزەیی اللە تعالی بۆ دەکەین . هەرکەسێك بگاتەوە دیداری پەروەردگار بە تاوانێکەوە کە دۆزەخی لەسەر واجب بکات . بەڵام تەوبەی کرد و سوور نەبوو لەسەر تاوانەکە ئەوە اللە تعالی تەوبەی داناوە وە تەوبە لە بەندەکانی وەردەگرێت . وە لە هەڵە و تاوانەکانی خۆشەبێت . وە ئەو کەسەی بگاتەوە دیداری اللە تعالی بەڵام لە دونیا حەدی شەرعی لەسەر جێبەجێ کرابوو ئەوە کەفارەتە بۆی . وەك چۆن لە پێغەمبەرەوە صلى اللە علیه وسلم ڕیوایەت کراوە و هاتووە . بەڵام ئەو کەسەی سووربووبێت لەسەر تاوانەکەی وە تەوبەی نەکردبێت لەسەر تاوانەکان ئەو تاوانانەی کە سزا واجب دەکەن لەسەری ئەوە حاڵەکەی دەچێتەوە لای اللە تعالی ئەگەر ویستی هەبێت سزای دەدات وە ئەگەر ویستیشی هەبێت لێی خۆشەبێت . وە ئەو کەسەی گەڕاوە بۆلای دیداری اللە تعالی کافر بێت ئەوە سزای دەدات و هەرگیز لێی خۆش نابێت .

## ( ڕەجم حەق و ڕاستە لەسەر ئەو كەسەی زینا دەكات كە پارێزبەندە )

ڕەجم حەق و ڕاستە لەسەر ئەو كەسەی زینا دەكات كە پارێزبەندە ئەگەر هاتوو دانی نا بە زیناكەی . یان بەڵگەیەكی ڕوون سەلماندی كە زینای كردووە . پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم ڕەجمی زیناكاری كردووە . وە جێنشینە هیدایەت دراوەكانیش ڕەجمی زیناكاریان كردووە .

## ( دووڕوویی و كەم كردنەوە لە حەقی هاوەڵان )

هەركەسێك لە فەزڵی یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم كەم بكاتەوە یان ڕقی لێبێت بەهۆی ڕووداوێك كە لێیان ڕوویداوە . وە باسی خراپیەكانی بكات ئەوە بیدعەچیە . تاوەكو ڕەحمەت بۆ هەموویان دەنێرێت وە دڵی بەرامبەریان تەندرووست بێت . نیفاق : بریتیە لە كوفر . بەوەی كە كوفر بە اللّه تعالی بكەیت وە غەیری ئەو بپەرستیت . لە ئاشكرا ئیسلامەتی بەدیار دەخات . نمونەی : دووڕووەكان ئەو دووڕووانەی لە سەردەمی پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم هەبوون . وتەی پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم كە دەفەرموویێت ( **سێ شت هەن كە هەركەسێك تێیدا هەبوو ئەوە دووڕووە** ) [٥] ئەوە لەسەر توندبوون . ڕیوایەت كراوە وەك هاتووە ڕاڤەی بۆ ناكەین وە وتەی پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم كە دەفەرموویێت **( لە پاش من كافر و گومڕا نەبنەوە هەندێكتان بدەن لە ملی هە ندێكی ترتان )**[٦] وە نمونەی (

---

( ٥ ) النسائي : الإيمان وشرائعه برقم : ٥٠٢٣
( ٦ ) البخاري : العلم برقم : ١٢١

**ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەوە گەیشتن بەیەك ئەوە بکوژ و کوژراو بۆ دۆزەخە)** [٧] وە نمونەی ( **جوێندان بە موسڵمان فاسق بوونە . وە شەڕکردنیشی کوفرە** )[٨] وە نمونەی ( **هەرکەسێك بە براکەی بڵێت ئەی کافر ئەك کافرکردنە بەسەر یەکێکیان دەکەوێت** )[٩] وە نمونەی ( **کوفرکردن بە اللّه تعالی لە نەسەب بەریت دەکات ئەگەر کەمێکیش بێیان بچوکیش بێت** )[١٠] وە نمونەی ئەم فەرموودانە کە بە صەحیحی هاتووە و لەبەرکراوە . ئێمە تەسلیمی دەبین ئەگەر واتاکەیشمان نەزانی . وە قسەی لەسەر ناکەین . وە موناقەشەی تێدا ناکەین . وە ڕاڤە بۆ ئەم فەرموودانە ناکرێت ئیلا بەو شێوەی کە هاتووە . وە ڕەتیشی ناکەینەوە ئیلا بە حەقی خۆی نەبێت .

---

( ٧ ) البخاري : الإيمان برقم : ٣١
( ٨ ) البخاري : الإيمان برقم : ٤٨
( ٩ ) ابخاري : الأدب برقم : ٦١٠٤
( ١٠ ) ابن ماجه : الفرائض برقم : ٢٧٤٤

## ( بەهەشت و دۆزەخ هەردووكیان مەخلوقن )

بەهەشت و دۆزەخ مەخلوقن وە درووستكراون . وەك لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە كە دەفەرمووێت ( **چووم بۆ بەهەشت كۆشكێكم بينی** ) [11] وە ( **وە ئاوی كەوسەرم بينی** )[12] وە ( **بەسە ر بەهەشتدا تێپەڕم كرد بينيم زۆرينەی دانيشتووانەكەی ...** )[13] بە هەمان شێوە دۆزەخم نێشاندرا بينيم ...فلان شت و فلان شت . هەركەسێك وا گومان بيات كە بەهەشت و دۆوەخ درووست نەكراون ئەوە ئەو كەسە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەريان صلى الله عليه وسلم بە درۆ خستۆتەوە . وە حيساب ناكرێت بەوەی كە باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ هەيە .

---

( ١١ ) البخاري : النكاح برقم : ٥٢٢٦
( ١٢ ) البخاري : تفسير القرأن برقم : ٤٩٦٤
( ١٣ ) البخاري : بدء الخلق برقم : ٣٢٤١

( هەرکەسێك لە ئەهلی قیبلە مرد بە موەحیدی ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێت و داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکرێت )

هەرکەسێك لە ئەهلی قیبلە مرد بە موەحیدی ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێت و داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکرێت وە هیچ شتێك لە لێخۆشبوون ڕێگری لێناکات . وە واز لەنوێژکردن لەسەری ناهێنرێت لەبەر کردنی تاوانێك جا بچوك بێت یان گەورە بەڵکو حاڵی دەچێتەوە بۆلای الله تعالى .

کۆتایی ڕیسالەکە

الحَمْدُ للهِ وَحْدَه وَصَلَواتُهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَسَلِّمْ تَسْلِيماً

الحمدلله کۆتایم بە وەرگێڕانی هێنا لە دوای نوێژی عەسر لە ٢٠٢٠/١٠/٢٠ م